لە بڵاو كراوەكانی ماڵپەڕی بەهەشت

# نوێـژی بەیـانـی

## خەرمانێك لە مژدە و پـاداشت

وەرگێڕانی

پشتیوان حەسەن كەرەم

-------------------------------------------------------

ماڵپەری بەهەشت

ba8.org

ماڵپەڕێكی ئیسلامی زانستی پەروەردەیی یە و لەپێناو بڵاوكردنەوەی ئەو ئیسلامەیە كە سەلەفی صالح - پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی (رضي الله عنهم) لەسەری بوون - وە سەر بە هیچ گروپ و لایەنێكی حیزبی نیە.

## ماڵپەری بەهەشت

**ئەو کتێب و بابەت و لێکۆڵینەوە شەرعیانە بڵاو دەکاتەوە کە دەبنە هۆی:**

١. شارەزاکردنی موسوڵمانان و پەروەردەکردنیان لەسەر رێگا ڕاستەکەی ئیسلام، ئەمەش دەستەبەر دەبێ بە گەڕانەوە بۆ پەیڕەوە رەسەنەکەی ئیسلام،کە بریتی یە لە قورئان و سوننەت،بە تێگەشتنی پێشین وپێشەوایانی ئوممەت.

٢. پاک کردنەوەی بیروباوەڕ و ڕەوشتی موسوڵمانان، لە دیاردەکانی شیرک و کوفر و تاوان.

٣. پاڵاوتن و تەصفیەکردنی ئاینی ئیسلام لە بیدعە و بۆچونە داهێنراوەکان.

٤. وریا کردنەوەی موسوڵمانان لە شوێنەواری خراپی ڕیوایەتە لاواز و هەڵبەستراوەکان.

٥. پتەو کردنی برایەتی یەکی ڕاستەقینە لەسەر بناغە فراوانە جێگیرەکەی ئیسلام و نەهێشتن و کەمکردنەوەی دەمارگیری مەزهەبی و حیزبی.

**ئامانجمان:**

ئاشناکردنی کۆمەڵگایە لە ئیسلامی ڕەسەن و دروستکردنی تاك و کۆیەتی بۆ تێگەشتن لە سەرچاوەکانی کە بریتین لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی صەحیح و ئاشکراکردنی ئەو شتانەی کە نامۆن بە ئیسلام و خراونەتە نێویەوە بە چەندین دەستەواژەی دەنگ و ڕەنگ و نوسراوی لە بوارەکانی بیروباوەڕ و ڕەوشت و ئاکار و پەروەردە و زانست و پزیشکی و گەشەی کۆمەڵایەتی.

**خودایە داوات لێ دەکەین دامەزراومان بکەیت ، وتەوفیقمان بدەیت بۆ هەر کار وگوفتارێکی جوان وچاک بەو شێوەیەیی کەخۆت لێی ڕازیت.**

**ستافی ماڵپەڕی بەهەشت**

بسم الله الرحمن الرحيم

# نوێــژی بەیــانی خەرمانێك لە مژدە و پاداشت

**لە ئاینی ئیسلامدا نوێژ فەزڵی دراوە بەسەر هەموو خواپەرستیەکانی تردا جگە لە یەکخواپەرستی نەبێت، وە خوای گەورە دیاری کردووە و هەڵی بژاردووە بۆ ئەوەی ببێتە جیاکەرەوەی نێوان ئیمان و کوفر.**

عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ قال : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ : " **بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكُ الصَّلَاةِ** "

( رواه مسلم ) ، **واتە: لەنێوان مرۆڤ و شیرك و بێباوەڕیدا وازهێنانە لە نوێژ.**

وعن عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم : " **الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمُ الصَّلَاةُ فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ** " ( رواه الترمذي وغيره، وصححه الألباني في المشكاة برقم ٥٧٤ )

**واتە: ئەو پەیمانەی لەنێوان ئێمە و بێباوەڕان یان دووڕووەکاندایە بریتیە لە نوێژ جا ئەوەی نەیکات و وازی لێ بهێنێت ئەوا کوفری کردووە.**

**هەربۆیە چۆنێتی فەرزبوون و واجب بوونی نوێژ جیاوازە لە هەموو عیبادەتەکانی تر، بەڵکو بەو شێوەیە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان و لەوێدا نوێژی لەسەر فەرزکرا، بۆ ئەوەی ئومەت پلەوپایەی نوێژ بزانن و ڕێزی نوێژ هەست**

**پێ بکەن، و بەگەورە سەیری بکەن وبیێتە بەرچاویان، بۆیە نوێژ کۆڵەکەی دینەو ئەو پایەگرنگەیە کە کە دینی پێ ڕاگیراوە، جا هەرکاتێکیش ئەو پایە نەماو ڕووخا ئەوا دینەکەشی ڕووخاوە پەنا بەخوا، هەربۆیە دینی نیە ئەوەی نوێژی نەبێت.**

عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ رضي الله عنه قَالَ : كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم فِي سَفَرٍ فَأَصْبَحْتُ يَوْماً قَرِيباً مِنْهُ وَنَحْنُ نَسِيرُ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ وَيُبَاعِدُنِي مِنَ النَّارِ ، قَالَ : " **لَقَدْ سَأَلْتَنِي عَنْ عَظِيمٍ ، وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ ، تَعْبُدُ اللَّهَ وَلاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً ، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ ، وَتَحُجُّ الْبَيْتَ** " ، ثُمَّ قَالَ : " **أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى أَبْوَابِ الْخَيْرِ ؟ الصَّوْمُ جُنَّةٌ ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ ، كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ ، وَصَلاَةُ الرَّجُلِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ** " ، قَالَ ثُمَّ تَلاَ : { تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ } حَتَّى بَلَغَ { يَعْمَلُونَ } ثُمَّ قَالَ : " **أَلاَ أُخْبِرُكَ بِرَأْسِ الأَمْرِ كُلِّهِ ، وَعَمُودِهِ ، وَذِرْوَةِ سَنَامِهِ ؟** " قُلْتُ : بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ ، قَالَ : " **رَأْسُ الأَمْرِ الإِسْلاَمُ ، وَعَمُودُهُ الصَّلاَةُ ، وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ** " ، ثُمَّ قَالَ : " **أَلاَ أُخْبِرُكَ بِمَلاَكِ ذَلِكَ كُلِّهِ ؟** قُلْتُ : بَلَى يَا نَبِيَّ اللَّهِ ، قَالَ : فَأَخَذَ بِلِسَانِهِ قَالَ : " **كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا** " ، فَقُلْتُ يَا نَبِيَّ اللَّهِ : وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِهِ ؟ فَقَالَ : " **ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يَا مُعَاذُ ، وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ - أَوْ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ - إِلاَّ حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ** " ( أخرجه الترمذي وغيره ، وقَالَ : هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، و صححه الألباني في صحيح وضعيف سنن الترمذي برقم ٢٦١٦ )

واتە: موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووم لە سەفەرێکدا و ڕۆژێك لێی نزیك بوومەوە کە بەڕێگادا دەڕۆیشتین:

ووتم ئەی پێغەمبەری خوا هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە کاروکردەوەیەك کە ئەگەر ئەنجامی بدەم بمباتە نێو بەهەشتەوەو لە ئاگری دۆزەخیش دوورم بخاتەوە، ئەویش فەرمووی:

" بەڕاستی پرسیارت سەبارەت بە شتێکی زۆر گەورە کرد، بەلاّم ئاسانیشە بۆ کەسێك خوا بۆی ئاسان کردبێت (ئەویش ئەوەیە):

خوا بەتەنها بپەرستەو هیچ هاوەڵی بۆ بڕیار مەدە، و نوێژەکانت ئەنجام بدە و زەکات بدەو ڕۆژوی ڕەمەزانیش بگرە و حەجی ماڵی خوایش بکە، پاشان فەرمووی: ئایا دەرگاکانی خێرت پێ پیشان نەدەم؟ ڕۆژو پارێزەرە (لەتاوان و لە ئاگر)، وە صەدەقەیش تاوان دەکوژێنێتەوە وەکو چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە، هەروەها نوێژیش لە ناوەڕاستی شەودا، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە { تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ } حَتَّى بَلَغَ { يَعْمَلُونَ } پاشان فەرمووی: ئایا سەری هەموو ئەمانەت پێ نەڵێم و کۆڵەکە و چڵەپۆپەی هەموویانت پێ ئاشنا نەکەم؟

ووتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی:

سەری بابەتەکە ئیسلامە و کۆڵەکەکەی نوێژەو چڵەپۆپەکەشی جیهادە، پاشان فەرمووی: شتێکت پێ نەڵێم هەموو ئەمانە لەخۆبگرێت؟ ووتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش زمانی خۆی گرت و فەرمووی ئەمەت بەسە، منیش ووتم:

ئەی پێغەمبەری خوا ، ئایا ئێمە ئەو شتانەی کە بەدەم و زمانماندا دێت لێکۆڵینەوەمان لەگەڵدا دەکرێت لەسەریان؟ ئەویش: فەرمووی: ئەی موعاز لەبار دایکت بچیت، ئایا خەڵکی وا هەیە بەسەر ڕوومەتدا ڕادەکێشرێن بۆ ناو ئاگر لەبەر ئەوە نیە کە بەزمانیان ووتویانە ولەبەر بەروبومی زمانیان ؟

وە لەنێوان نوێژەکاندا نوێژی بەیانی تایبەت کراوە بە زیادە پاداشت و چاکە و خێر و فەزڵ ، چونکە ئەو نوێژە سەنگی مەحەکی ئیمان و باوەڕە و نیشانەی تەسلیم بوون وخۆبەدەستەوەدان و ملکەچی نواندنە بۆ خوا بەشێوەیەك کە بڕواداری پێ لە دوڕوو جیادەکرێتەوە، عبداللە ی کوڕی ئیمامی عومەر (رضي الله عنهما) دەفەرموێ :
" كنا إذا فقدنا الرجل في الفجر والعشاء أسأنا الظن به " (رواه الطبراني وابن خزيمة ).
واتە: ئێمە ئەگەر یەکێکمان نەهاتایە بۆ نوێژی بەیانی و عیشا ئەوا گومانی خراپمان پێی دەبرد.

نوێژی بەیانی وەکو تاقی کردنەوەی کۆتایی ساڵ وایە، نوێژەکانی تر وەکو ئامادەکاریەکن بۆ ئەنجامدانی نوێژی بەیانی، لەڕاستیدا ئەوە تاقی کردنەوەی ڕاستەقینەیە بە ئەندازەیەك کە ئەوەی ئامادەی بێت ئەوا سەرکەوتوو و براوەیە و ئەوەش ئامادەی نەبێت و نەیەت ئەوا دۆڕا و زیانبارە.

هەروەکو چۆن ئەگەر هاتوو خوێندکار بەدرێژایی ساڵ ئامادەبوو بەڵام لەکاتی تاقی کردنەوەی کۆتایی ساڵدا ئامادە نەبوو ئەوا بە ڕاسب و دۆڕاو وسەرنەکەوتوو هەژمار دەکرێت، بەهەمان شێوەش نوێژی بەیانی وەهایە ئەوەی ئامادەی نەبێت ئەوا لە دۆڕاو و خەسارەتمەندان دەژمێررێت.

هەر بۆیە شەرعی ئیسلام چەندین پاداشت و خێری داناوە بۆ ئەو کەسەی کە نوێژی بەیانی دەکات کە بۆ نوێژەکانی تری دانەناوە، جا ئەنجامدەری نوێژی بەیانی براوەی فەزڵەکانەو مزگێنی و مژدەی خۆشی بەردەکەوێت و پێی دراوە، لەو مژدانەش:

## مژدەی یەکەم

## نـــورو ڕۆشناییەکی تەواو لە ڕۆژی دواییدا

**هەرلەکاتی دەرچوونی نوێژخوێن لەماڵەوە بـۆ مزگـەوت بـۆ ئەنجامـدانی نوێـژی بەیانی ئەوا مژدە لەهەموو لایەکیەوە بەسـەریدا دەرژێـت،** عَنْ بُرَيْدَةَ الأَسْلَمِيِّ ، عَنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ : " **بَشِّرِ الْمَشَّائِينَ فِي الظُّلَمِ إِلَى الْمَسَاجِدِ ، بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ** " [ رواه أبو داود والترمذي وصححه الألباني] **واتە: مژدەی نورێکی تەواو لەرۆژی دواییدا بدەن بەوانەی کە بەتاریکی دەڕۆن بۆ مزگەوتەکان.**

**ئەمەش واتای ئەوەیە ئەوەی نەڕوات بۆ نوێژی بەیانی ئەوا نوری تەواوی بۆ نیە لـە رۆژی دواییدا، ئەمەش یەکەم دەرئەنجامی نەرۆیشتنە بۆ نوێژی بەیانی کە کەم بـەش بوونە لەنور و ڕوناکی لە دواڕۆژدا.**

**جا هەروەکو چۆن ئەوەی پارێزگاری دەکات لە ئەنجامدانی نوێژی بەیانی ئەوا چەندین مژدەو چاکەی دڵخۆشکەری بۆ هەیە، ئاوەهاش ئەوەی پارێزکار نەبێت لەسەر نوێـژی بەیانی ئەوا مژدەی ناخۆش و هەڕەشەی توند و سەختی بۆ هەیە.**

## مـــژدەی دووەم

## باشترە لە دونیا

ئەگەر نوێژخوێن هەستا بە ئەنجامدانی دوو ڕكعات سوننەتی پێش نوێژی بـەیانی ئەوا چاكتــرە لە دونیا و ئەوەشی تێیدایە.

عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها ، عَنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ : "**رَكْعَتَا الْفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا**"[رواه مسلم]، يعني سنة الفجر **واتە: دوو ڕكعاتی سوونن‌ەتی نوێژی بەیانی چاكترە لە دونیا و ئەوەشی تێیدایە.**

جا كەسی پارێزگار لە نوێژی بەیانی لەمزگـەوت بەجەماعــەت بــەلێنی مــژدەی خۆش و پاداشتی گەورە و هەوڵی دڵخۆشكەری پێدراوە، بەشــێوەیەك كــە بەهۆیــەوە چێژ لەنوێژی بەیانیەكەی وەردەگرێت و وەكو بلێــی هــەموو دونیــای پــێ بەخشــراوە بەتەواوی جوانیەكانیەوە.

بەڵام ئەوەی دواكەوتووە لەنوێژی بەیانی و ئەنجامی نادات، لــە دونیــادا جگــە لــە سەرشۆڕی و نەنگی و ڕەوشت خراپی و دڵتەنگی و ڕوومـەت گرژی زیــاتر هیچــی بــۆ نیە، وە خەڵكی بە كەسێكی نارێك و ئیمان لاواز تەماشــای دەكــەن و بەكــەم دێتــە بەرچاویان، چۆن دەبێت موسڵمان بێت و پارێزگاری نەكات لــە نوێــژی بــەیانی كــە سەنگی مەحەكی ڕاستەقینەی باوەڕ و ئیمانداریێتیــە و جیاكــەرەوەی نێــوان بــاوەڕ و دوڕوویيە.

## مژدەی سێیەم

## چنینەوەی چاکەکان

کاتێك کە نوێـژخوێن دادەنیشـێت بـۆ نوێـژ و لەچـاوەڕوانی نوێژدایـە ئـەوا لـەناو نوێژدایە مادام نوێژ گیری داوە و ڕاگیری کردووە.

عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم :

**" مَـنْ خَـرَجَ مِـنْ بَيْتِـهِ إِلَى الْمَسْـجِدِ كُتِـبَ لَـهُ بِكُـلِّ خُطْـوَةٍ يَخْطُوهَـا عَشْـرُ حَسَـنَاتٍ ، وَالْقَاعِدُ فِي الْمَسْجِد يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ كَالْقَانِتِ ، وَيُكْتَبُ مِنَ الْمُصَلِّينَ ، حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى بَيْتِهِ "** [ أخرجه أحمد]

**واتە: ئەوەی لەماڵەکەی دەربچێت بۆ مزگەوت بەهـەر هـەنگاوێکی کـە دەینـات دە چاکەی بۆ دەنووسرێت، ئەوەشی لە مزگەوت دادەنیشێت و چاوەڕێی نوێژ دەکات وەکو قانت وایە (کەسی پارێزگار لەسەر عیبادەت) و لە نوێـژخوێنان دەنووسـرێت هـەتا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی.**

**الله أكبر ... ئـای ئـەو کەسـەی کـە کەمتەرخەمـە لـە نوێـژی بـەیانی چـەند پاداشتێکی گەورەی لەدەست دەچێت، و خۆی بێبەش دەکـات لـە خێرێکـی نـەبڕاوەو چاکەیەکی دوانەهاتوو، خێری دوو ڕکعاتی سوننەتی پێش نوێژ، خێری هەنگاوەکانی ڕۆیشتن بۆ مزگەوت، خێری خوێندنی قورئان تا قامەت دەکرێـت، خێـری چـاوەڕوانی**

لەناو مزگەوت تا کاتی قامەت، ئەگەر ئەم خێرو چاکانە بژمێردرێن دەگەن بە ملیۆنەها، چونکە هەر چاکەیەك بە دە قات وەردەگیرێت و هەتا حەوت سەد قات و لەوەش زیاتر.

وە هەروەها کەسی کەمتەرخەم لە نوێژی بەیانی ئەوە دەزانێت کە چەند دوعاو پاڕانەوەی فریشتەکانی لەدەست دەچێت، ئەو فریشتانەی کە بەندەخواپەرستەکانی خوان، کە بە ئەندازەی چاوپروکاندنێکیش بەڵکو لەوەش کەمتر سەرپێچی خوا ناکەن، بەڵکو دروستکراون تەنها لەپێناو گوێڕایەڵی و پەرستشی خوای گەورەدا، جا ئەو کەسەی کە ئامادەی نوێژی بەیانی نیە دوعای ئەو فریشتانەی لەدەست دەچێت و خۆی لێ بێبەش دەکات کە دوعای ڕەحمەت و لێخۆشبوون دەکەن، ئەوەش کارێکی خێرداره بەڵام ئەوەی ئامادەی نوێژی بەیانی نیە لەدەستی دەچێت و نایگرێتەوە کە فریشتەکان داوای بۆ دەکەن لەویدا.عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ : " **إِنَّ أَحَدَكُمْ مَا قَعَدَ يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ فِي صَلاَةٍ مَا لَمْ يُحْدِثْ ، تَدْعُو لَهُ الْمَلاَئِكَةُ : اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ** " [ رواه أحمد ] واتە: ئەگەر یەکێکتان لە مزگەوتدا دانیشت و چاوەڕێی نوێژی دەکرد ئەوا لەناو نوێژدایە تا دەستنوێژەکەی نەشکابێ، فریشتەکان بۆی دەپاڕێنەوە ودەڵێن: خوایە لێی خۆش بە، خوایە ڕەحمی لێ بکە.

## مـــژدەی چـــوارەم

## ئامادەبوونی فریشتەکان بۆ ئەم نـــوێـــژە

کاتێك کە نوێژ دادەبەسترێت و نوێژخوێن دەچێتە ناو نوێژەوە، ئەوا لە پێش خوایەکدا دەوەستێ کە پاشای هەموو پاشـاکانە، و خەزێنـەی ئاسمانـەکان و زەوی بەدەسـتە، و دەوڵەمەند وبێ پێویستە، لەوکاتەشدا فریشـتەکانی خـوای گـەورە ئامـادەی دەبـن، خوای گەورە دەفەرموێ : { أَقِمِ الصَّلاَةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَى غَسَقِ اللَّيْلِ وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُوداً }[ الإسراء٧٨ ]

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەی ئیماندار : نوێژ بەجێ بهێنـە لـەکاتی لادانـی خـۆر لەناوەڕاستی ئاسمان هەتا هاتنی تاریکی شەو و هەروەها نوێژی بەیانی بەجێ بهێنەو فەرامۆشی مەکە (چونکە) بەڕاستی قورئان خوێندنی نوێژی بـەیانی فریشـتەکانی شەو و رۆژ ئامـادەی دەبن و دەیبینن.

بەڵام ئەو کەسەی کە نایەت بۆ نوێژی بەیانی ئامادەبوونی فریشـتەکان لەگەڵیـدا لەدەست دەدات و ئەو فەزڵە گەورەیەی لەدەسـت دەچـێت، کاتێـك کـە فریشـتەکان کۆدەبنەوە بۆ ناونووس کردنی ئەو کەسانەی گوێڕایەڵی فـەرمانی خوایـان کـردووە و بەدەم بانگەوازی خواوە هاتوون بە ئامادەبوونیان لە مزگەوت بۆ ئەنجامـدانی نوێـژی بەیانی بـە کۆمـەڵ و لـەکاتی دیـاری کـراوی خۆیـدا، بـەڵام بەپێچـەوانەوە ئـەوەی

ئامادەنەبێت ئەوا لە بێ ئاگا و خەواڵووەکان ناونووس دەکرێت و لەوانەی کە وازیان لە نوێژی بەیانی هێناوە تۆمار دەکرێت، جا هەڵوێستی چۆن دەبێت بەرانبەر بە دروستکارو پەروەردگارەکەی، و بیانوو پۆزشی چی دەبێت بەرانبەر بە خوا لە نەهاتنیدا بۆ نوێژ؟

بیانووی چی دەبێت لە رۆژی دواییدا کاتێك کە نامەی کردەوەکان دەکرێنەوە بۆ خوێندنەوەیان و ئامادە دەکرێن، و هەموو مرۆڤێکیش نامەکەی خۆی وەردەگرێت، جا یان ئەوەتا بە دەستە ڕاستی وەری دەگرێت یاخود پەنا بەخوا بەدەستە چەپی، یان بیانووی چی دەبێت بەرانبەر بە خوایەك کە هیچ شتێکی لا شاراوە نیە؟

عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ : " **تَجْتَمِعُ مَلائِكَةُ اللَّيْلِ وَمَلائِكَةُ النَّهَارِ فِي صَلاةِ الْفَجْرِ** " ، ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ : فَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ : { إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُوداً } [ متفق عليه ]. **واتە: فریشتەکانی شەو و رۆژ لەکاتی نوێژی بەیانیدا یەك دەگرن و کۆدەبنەوە، پاشان ئەبوهورەیرە دەڵێت: ئەگەر ویستتان ئەم ئایەتە بخوێننەوە:** ﴿ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُوداً ﴾.

ئای ئەو کەسەی ئامادەنەبوو لە نوێژی بەیانی چەند خێرو چاکەی لەدەست دەچێت، چەند پلەو پایە لەدەست خۆی دەدات، و چەند تاوان و خراپەی لەسەر خۆی داناوە وبارکردووە، و چەند پلە بەرەو خوار رۆیشتووە لەبری ئەوەی بەرز ببێتەوە.

## مژدەی پێنـجـەم

## چوونە بەهەشت و رزگاربوون لە ئـــــاگـــــر

کاتێك کە قامەت دەکرێت بۆ نوێژ و نوێژخوێن دەچێتە نـاو نوێـژەوە، ئـای چـەند سـەرکەوتن و بردنەوەیـەکی گـەورە و پاداشـتێکی نـەبڕاوەی بـۆ هەیـە، و دەبێـت بەخاوەنی چ فەزڵ وبەخششێکی خوایی !! چۆن وانیە، لەکاتێکدا ئـەو لـە پێشـگای خوایەکدا وەستاوە کە خاوەنی هەموو شتێکە و لابەری خەم ودڵتەنگی و ناسـۆریە، و گەنجینەکانی ئاسمانەکان و زەوی بەدەستی ئەوەو دەوڵەمەند و بەخشندەیشە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویـەتی : " لَنْ يَلِجَ النَّارَ أَحَدٌ صَلَّى قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا " يَعْنِي الْفَجْرَ وَالْعَصْرَ " ( رواه مسلم ) واتە: ناچێتە نـاو ئـاگری دۆزەخـەوە کەسێك کە پێش دەرچوونی خـۆر و پـێش ئـاوابوونی نوێـژ بکـات (واتـە بـەیانی و عەصر).

جا ئەوەی نوێژی بەیانی و عەصر نەکات ئەوا بەر ئەم فەرموودەیە ناکەوێت و دڵنیا نیە لە رزگاربوونی لە ئاگر، بەڵکو دوور نیە کە بچێتە ناو ئاگرەوە پەنا بەخوا.

وعن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم : " مَنْ صَلَّى الْبَرْدَيْنِ دَخَلَ الْجَنَّةَ " [ متفق عليه ] ، والبردان : هما الفجر والعصر .واتە: ئەوەی ئـەو دوو نوێـژە

**ئەنجام بدات کە لەکاتی سەرمادا دەکرێن ئەوا دەڕواتە بەهەشتەوە، (مەبەست لە نوێژی بەیانی و عەصرە).**

**جا ئەوەشی ئامادەی نەبێت و بەتایبەتی ئەو دوو نوێژە نەکات ئەوا لەوانە ناژمێررێت کە جێگاو نوێنی نەرم و گەرم بەجێ دەهێڵن، و لەوانە هەژمار ناکرێن کە وەڵامی بانگەوازەکەی خوایان داوەتەوە کاتێك کە بانگبێژ لە بڵندگۆکانەوە بانگی دەکات و دەڵێت:**

{ حي على الصلاة ، حي على الفلاح ، الصلاة خير من النوم } ، **جا نوێژ لەو کاتەدا سەرکەوتنە بۆ بەندە لە دونیا و دوارۆژدا و ئەوەشی ئەنجامی نەدات رزگاربوون و قوتاربوونی بۆ نیە مەگەر بەزەیی خوا بیگرێتەوە .**

## مژدەی شەشەم

## بینینی خوای پەروەردگار

**ئومێد دەکرێ بۆ ئەو کەسەی کە بەردەوامە لەسەر ئەنجامدانی نوێژی بەیانی و عەصر یەکێك بێت لەوانەی کە خوای پەروەردگاریان دەبینن.**

فعَنْ جَرِيرِ بن عبد الله رضي الله عنه قَالَ : كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم فَنَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ لَيْلَةً - يَعْنِي الْبَدْرَ - فَقَالَ : " **إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ لاَ تُضَامُّونَ** ــ تضارون ــ **فِي رُؤْيَتِهِ ، فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لاَ تُغْلَبُوا عَلَى صَلاَةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا** " يعني الفجر والعصر ، ثُمَّ قَرَأَ : { وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ } ، قَالَ إِسْمَاعِيلُ ــ أحد رواة الحديث ــ افْعَلُوا لاَ تَفُوتَنَّكُمْ [ متفق عليه]

**واتە: جەریری کوڕی عبداللە دەڵێت: ئێمە لای پێغەمبەر بووین ﷺ جا تەماشای مانگی کرد کە لەو کاتەدا مانگی چواردەبوو، پاشان فەرمووی: ئێوە لە ڕۆژی دواییدا پەروەردگارتان دەبینن وەکو چۆن ئەم مانگە دەبینن و هیچ نارەحەتیەکتانیش تووش نابێت لەکاتی بینینەکەدا بەوەی پاڵ پاڵێن و قەرەباڵغی ڕووبدات بەڵکو بەئاسانی وجوانی دەیبینن، جا (بۆ ئەو مەبەستە) ئەگەر توانیتان با هیچ هۆکارێکی بێ ئاگاییتان بەسەردا زاڵ نەبێت لەوەی نوێژی پێش دەرچوونی خۆر و**

پێش ئاوابوونی بکەن، (واتە نوێژی بەیانی وعەصر) پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ ﴾.

**الحافظ ابن حجر** (رحمه الله) دەڵێت : زانایان دەڵێن: هۆکاری باسکردنی ئەو دوو نوێژە لەگەڵ بابەتی بینینی خوادا، ئەوەیە کە نوێژ خۆی باشترین عیبادەتە، و بەتایبەتیش چەندین فەزڵ و چاکە سەبارەت بەو دوو نوێژە هاتووە و باسکراوە کە بۆ نوێژەکانی تر باس نەکراوە، لە کۆبوونەوەی فریشتەکان و بەرزبوونەوەی کردەوەکان و جگە لەوانەش، جا بۆیە ئەو دوو نوێژە باشترینی نوێژەکانن، بۆیە گونجاوە کە بکەری ئەو نوێژە پاداشت بدرێتەوە بە باشترین پاداشت و چاکە کە ئەویش بریتیە لە بینینی خوای گەورە لە رۆژی دواییدا.

ئابەو شێوەیە خەڵکی ئامۆژگاری یەکتر دەکەن لەسەر ئەنجامدان و بەردەوام بوون لەسەر نوێژەکان بە جەماعەت لە مزگەوتدا، لە نێوانیشیاندا هەردوو نوێژی بەیانی و عەصر تایبەت کراوە، لەبەر گرنگیان، چونکە ئەو دوو نوێژە لەدوای پشوودان و خەوەوە دێن، کەمێکیش لە خەڵکی ئامادەی دەبن ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم

کەسێك کە ئیمان و باوەڕ لەدڵیدا دانەمەزرابێت و خۆشەویستی دوارۆژ لە ناخیدا نەبێت بەردەوام نابێت لەسەر ئەو دوو نوێـژە و چـونکە ئـەو کاتـە ئامادەیـە دونیـا بفرۆشێت بە دوارۆژی.

بەپێچەوانەشەوە کەسێك کە هەموو خەم و خەفەتی خەوتن و خواردن و خواردنـەوەو کۆکردنەوەی مـاڵ وسامـان بێت بەپلەی یەکەم و نوێژەکانیشـی بەپلـەی دووەم بـن ئـا ئەوە دۆڕاو زیانبارە .

## مژدەی حەوتەم

## پاداشتی شەونـوێـژ

بەو شێوەیە مژدەکان بەردەوامن بۆ کەسانی خاوەن هیممەت بەرز و ئەوانــەی پلــەو شوێنی بەرز دەخوازن لەبەهەشتدا.

عن عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ رضي الله عنه قال : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ : " **مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا قَامَ نِصْفَ اللَّيْلِ ، وَمَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا صَلَّى اللَّيْلَ كُلَّهُ** " [ رواه مسلم] .

**واتە: ئەوەی نوێژی عیشا بە جەماعەت بکات وەکـو ئـەوە وایـە کـەنیوەی شـەوەکە شەونوێژی کردبێت، وە ئەوەشی نوێژی بەیانی بەجەماعەت بکات وەکو ئەوە وایە کە هەموو شەوەکە شەونوێژی کردبێت.**

## مژدەی هەشتەم

## دوعاو پاڕانەوەی فریشتە

ئای فەزڵی خوای میهرەبان چەندە زۆرە بۆ کەسێك کە گوێڕایەڵی بکات و بەپێی قورئان و سوننەت کاروکردەوە بکات، چونکە فەزڵ وچاکەی خوا تەنها بە نوێژەوە کۆتایی نایەت بەڵکو نوێژخوێن بەبەردەوامی لەناو پاداشتێکی گەورەدایە، و چاودێری خوایی دەورەی داوە و فریشتەکانیش بۆی دەپاڕێنەوە.

عَنْ علي بن أبي طالب رضي الله عنه قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ : " **مَنْ صَلَّى الْفَجْرَ ثُمَّ جَلَسَ فِي مُصَلاَّهُ ، صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ ، وَصَلاَتُهُمْ عَلَيْهِ : اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ** " [ رواه أحمد وحسن إسناده الشيخ أحمد شاكر]

واتە: ئەوەی نوێژی بەیانی بکات و پاشان لە نوێژگەکەی دابنیشێت ئەوا فریشتەکان صەلاواتی لەسەر دەدەن، و صەلاواتەکەش بەم شێوەیەیە کە دەڵێن: خوایە لێی خۆش بە، خوایە ڕەحمی لێ بکە.

جا ئەوەی کە خەوتووە لەکاتی نوێژی بەیانیدا ئایا پشکی هەیە لەم دەستکەوتەدا و بەشدارە تێیدا؟ نەخێر، سوێند بەخوا تەنها خەسارەتمەندی و زیانباری بەردەکەوێت و پەشیمانی چاوەڕوانی دەکات.

وە ئایا کەسێك گوێڕایەڵی خوا بێت هاوتای کەسێکە کە سەرپێچی خوا دەکات؟

کەسێك کە وازی لە دونیـا و جـوانی و ڕازاوەییـەتی هێنـاوە و سـەرقاڵە بەنوێـژەوە لەوکاتەدا وەکو کەسێك وایە کە هەموو هەوڵ و خەم و گرنگیـەکی دونیایـە و وازی لە نوێژ هێناوە؟ نەخێر بە هیچ شێوازێك وەکو یەك نیـن.

## مژدەی نــــۆیەم

## پاداشتی حەج و عومرەیەك

ئەگەر ئەو کەسەی کە نوێژی بەیانی بە جەماعەت لە مزگەوتدا دەکات و بڕیـاری یەکلاکەرەوە بدات و بەسەر نەفسی خۆیدا زاڵ بێت و شەیتان نائومێد بکات بـەوەی بتوانێت لەو شوێنەیدا دابنیشـێت هـەتا خـۆر دەردەچـێت، ئـەوا پاداشـتی حـەج و عومرەیەك بۆ خۆی بەدەست دەهێنێت.

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم : " **مَنْ صَلَّى الْغَدَاةَ** ـ الفجر ـ **فِي جَمَاعَةٍ ، ثُمَّ قَعَدَ يَذْكُرُ اللَّهَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ ، كَانَتْ لَهُ كَأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ** " [ رواه الترمذي وصححه الألباني في صحيح الجامع برقم ٦٣٤٦ ] .

واتە: ئەوەی نوێژی بەیانی بە جەماعەت بکات و پاشان دانیشێت زیکری خوا بکات هەتا خـۆر دەردەچـێت و دواتـر دوو ڕکعـات نوێـژ بکـات، ئـەوا پاداشـتی حـەج و عومرەیەکی تەواو تەواو تەواوی بۆ هەیە.

جا کوان ئەوانەی کە تامەزرۆی حەجن یان عومرەن وا پاداشتەکان لـەنزیك ماڵـتـان بـۆ ئامادەیـە و بەشـێوەیەك کـە چـاکە و پاداشـت دەڕژێتـە نێـو نامـەی کـردەوە چاکەکانتەوە.

## مژدەی دەیەم

## لەژێر چاودێری و پارێزگاری خوادایە

مژدە یەك لەدوای یەكەكانی خواو پێغەمبەرەكەی ﷺ بەردەوامە بۆ نوێژخوێنی بەیانی بەجەماعەت، تەنانەت كار گەیشتۆتە ئەوەی كە ئەو كەسە لە ژێر پاراستنی خوادایە ئەو رۆژە.

فعن جندب بن عبد الله رضي الله عنه قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم : " مَنْ صَلَّى صَلاَةَ الصُّبْحِ فَهْوَ فِي ذِمَّةِ اللَّهِ ، فَلاَ يَطْلُبَنَّكُمُ اللَّهُ مِنْ ذِمَّتِهِ بِشَيْءٍ ، فَإِنَّهُ مَنْ يَطْلُبْهُ مِنْ ذِمَّتِهِ بِشَيْءٍ يُدْرِكْهُ ،ثُمَّ يَكُبَّهُ عَلَى وَجْهِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ "( رواه مسلم ).

واتە: ئەوەی نوێژی بەیانی بەجەماعەت بكات ئەوا لە ژێر پاراستن و ئەمانەتی خوادایە، جا كارێك مەكەن كە خوا دواتان بكەوێت لەوەی پەیمانی داوە بیپارێزێت، چونكە خوای گەورە دوای هەركەس بكەوێت لەوەی پەیمانی داوە بە شتێك ئەوا دەیگرێت وپاشان بەڕوودا دەیخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

ئەمەش مانای ئەوەیە كە ئەوەی نوێژی بەیانی نەكات بەو شێوەیە ئەوا شەیتان لە ئەستۆی دەگرێت، و پێی پێ دەكەنێت، و بەلایەوە گرنگ نیە لەهەر دۆڵێكدا فڕێی بدات، دەستبەرداری دەبێت.

**جا لە کۆتاییدا** بەڕێزان بینیتان کە کەسی ئامادەبوو لە نوێژی بەیانی چەند فەزڵ و پاداشتی بۆ هەیە و ئەوەشی ئەو نوێژە ناکات چەند چاکەی گەورەی لەدەست خۆی داوە؟

داوای بەردەوامی لەخوای گەورە دەکەین لەسەر دینەکەی.